تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

خیلافەتی ئەمیری ئیماندارا ن

# عبدالله‌ی كوڕی زوبیر رضي الله عنهما

نووسینی
دكتور علي محمد الصلابي

وەرگێڕانی
ئەبوبەكر ڕەسول محمد

نارين

دار المعرفة
بەیرووت

## خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران

# عبداللەی کوڕی زوبێر رضي الله عنهما


نوسینی

دکتور علي محمد الصلابي

وەرگێرانی

ئەبوبەکر ڕەسول محمد



نارین

دار المعرفة

بەیرووت

ناوی کتێب بەعەربی: خلافة عبدالله بن الزبير
نوسینی: دکتۆر علی محمد الصلابی
ناوی کتێب بە کوردی: خیلافەتی ئەمیری ئیمانداران عبداللە کوڕی زوبێر
وەرگێڕانی: أبوبکر رسول محمد
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم/٢٠١٠ز
ژمارەی سپاردن: (١٥٩٤) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

کتێبخانەی نارین
هەولێر - چوارپیانی شێخ محمودی حەفید
بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
ژ. ت/(٠٠٩٦٤) ٢٥١١٩٨٢ ٦٦
E- mail: nareen_١@yahoo.com
www. nareenco.com

**ئەم کتێبە دیارییە بۆ:**

ـ زانایانی ئیشکەر.

ـ بانگخوازانی دڵسۆز.

ـ زانستخوازانی تێکۆشەر.

ـ ڕۆڵە بوێرەکانی ئۆممەت.

لە پەروەردگاری باڵا دەست ومەزن

دەپاڕێمەوە بەناوە جوانەکانی و

سیفەتە بەرزەکانی ئەم کارەم

لەبەر خاتری زاتی بەرزی بێت.

﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ الكهف:١١٠.

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينهُ ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن اله الا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ آل عمران:١٠٢.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ النساء:١.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ الأحزاب:٧٠،٧١.

ئەی پەروەردگارم؛ سوپاسێك بۆ تۆ شایەنی گەورەیی ذات ودەسەڵاتت بێ، سوپاس بۆ تۆ تا ڕازی دەبی، سوپاس بۆ تۆ كاتێك ڕازی بویت، سوپاس بۆ تۆ دوای ڕەزامەندیت.

ئەم كتێبە: بەشێكە لەكتێبی ((الدولة الأموية. عوامل الأزدهار وتداعيات الأنهيار))، لەبارەی ئەمیری ئیمانداران عبداللەی كوڕی زوبێر دەدوێ.

لە نێویدا قسەم كردووە لەسەر:

ناوی، بنەچەكەی، ناسناوی، پێگەیشتنتی، سیفەتەكانی، لەدایكبوونی، بەیعەتدانی بەپێغەمبەرﷺ، زوبێری باوكی ﷺ، ئەسمائەی دایكی ﷺ چەند هەڵوێستێكی زیندووی دایكی، ڕۆڵەكانی، هاوسەرەكانی، ئاستی شارەزایی، زانستی، پەرستنی، پارێزگاریەكەی، بوێری وئازایەتیەكەی، زمانپاراوی ووتار بێژیەكەی، سەخاوەت ودڵ فراوانیەكەی، پوچەڵكردنەوەی تۆمەت و بوختانێك، كە دەڵێ چروك و دەستقوچاو بووە، ڕۆڵی لەسەردەمی خیلافەتی (ئەبوبەكرو عومەرو

عوسمان وعەلی ومعاویە)دا ﷺ ڕۆڵی لە جەنگی (یەڕموك)دا، لەنوسینەوەی قورئانی پیرۆز لەسەردەمی عوسماندا، لەپاسەوانیکردن و بەرگریکردن لەعوسمان لەڕۆژانی گەمارۆدرانیدا، لەڕۆژی (جَمَل)دا، هەروەها بەشداری کاریگەری لەڕیزی سوپای یەزیدی کوڕی معاویە بەرەو (قوستەنتینییە)، ئینجا قسەم کردووە لەسەر: بزوتنەوەی عبداللەی کوڕی زوبێر لەسەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە، چۆنیەتی بەیعەتدان بە(یەزید)، سیاسەتی (یەزید) بۆ ڕاکێشانی خەڵکی شام بەلای خۆیدا، بەیعەتنەدان بە(یەزید) لەلایەن عبداللەی کوڕی زوبێر، جێگیربوونی (عبداللە) لە(مەککە)، هۆیەکانی هەڵبژاردنی (مەککە)، هۆیەکانی دەرچوونی ئەو و هاوەڵەکانی، هەوڵە ئاشتیەکانی (یەزید) بۆ گێڕانەوەی (عبداللە)، شەڕەکانی (یەزید) لەگەڵ (عبدالله)کە خۆیان لە هێرشی (عەمری کوڕی زوبێر)، پاشان هێرشی (حەسین کوڕی نەمیر)و گەمارۆدانی (عبدالله)و سوتانی (کەعبە)دا دەنواند.

ئینجا قسەم کردووە لەسەر: مردنی یەزیدی کوڕی معاویە، خیلافەتی معاویەی کوڕی یەزید، وازهێنانی معاویە لەحوکمڕانی و بەجێهێشتنی بۆ شوڕا، بەیعەتدانی خیلافەت بەعبداللەی کوڕی زوبێر، دەرچوونی مەڕوانی حەکەم لەدژی (عبداللە)و لەنێوبردنی پشتیوان ولایەنگرانی لە(شام)، بایەخی کۆبوونەوەی (جابیە)، جەنگی (مەرج ڕاهیت)، گێڕانەوەی (میصر) بۆ ژێر دەسەڵاتی (ئومەوی)، هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی عێراق وحیجاز بۆ ژێر دەسەڵاتی ئومەوی.

ئینجا قسەم کردووە لەسەر: (عبداللەی کوڕی مەڕوان)و کرانی بەوەلی عەهد، مردنی(مەڕوانی کوڕی حەکەم)، ململانێ ی نێوان عبدالملك و (ئیبن زوبێر)، ئەو بزوتنەوانەی لەو سەردەمەدا هاتنە ئاراوە وەك: بزوتنەوەی (تەووابین) و بزوتنەوەی موختاری و هی تریش.

لەکۆتاییدا قسەم کردووە لەسەر:

کۆتایی هاتنی - خیلافەتی - ئەمیری ئیمانداران (عبداللەی کوڕی زوبێر) دوای گەمارۆدانی وکوژرانی، هۆیەکانی ڕوخانی خیلافەتەکەی، هەندێك هۆنراوە کە بۆ لاواندنەوە پێیدا گوتراون.خێرو چاکە لەسەرەتاو لەکۆتادا هەرهی خودایە، لەذاتی

پاکو بەرزی دەپاڕێمەوە بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی ئەم کارە بۆ خاتری ئەو بێت و، مایەی سودیش بێ بۆ بەندەکانی، لیّ ی دەپاڕێمەوە لەسەر هەر پیتێك نوسیومە پاداشتم بداتەوەو بۆم بخاتە نێو تاتەرازوی کردەوە چاکەکانمەوە، هەروەها پاداشتی هەموو ئەو برایانەم بداتەوە یاریدەیان کردووم لەتەواو کردنی ئەم هەوڵو تێکۆشانە کەمەم، هومێدەوارین هەر موسڵمانێك ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە منی بەندەی هەژار لەئاقاو لێبوردن ولێخۆشبون وبەزەیی و ڕەزامەندی خودای لەبیر نەچێت ونزام بۆ بکات، ﴿رَبِّ أوزِعني أن أشكر نعمتك التي أنعمت عليَّ وعلى والدِيَّ، وأن أعملَ صالحاً ترضاه، وأدخلني برحمتك في عبادِك الصالحين﴾

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

هەژاری بەرقاپی خودا

علي محمد محمد الصلابي.

# بەشی یەکەم

## ناوو بنەچە و ناسناوو پێگەیشتن وشێوەی و گرنگترین سیفەتەکانی عبداللەی کوڕی زوبێر:

### یەکەم: ناوو بنەچە و ناسناوی.

ئەو: (عبداللەی کوڕی زوبێری کوڕی عەووامی کوڕی خووەیلیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی عبدالعزی ی کوڕی قوسەی ی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕە)یە، ئەمیری ئیمانداران، ئەبو بەکر وئەبو خوبەیب ی، قورەیشی ئەسەدی مەککی پاشان مەدەنی یە، یەك لەناوداران، کوڕی حەواری وکوڕی کوڕەپوری پێغەمبەری خودا (زوبێری کوڕی عەووام)ە.[١]

### دووەم: لەدایکبوونی وبەیعەتدانی بە پێغەمبەر ﷺ.

لە ئەسمائەی کچی ئەبوبەکر گێڕدراوەتەوە: کە ئەو لەمەککە بەعبداللەی کوڕی زوبێر دوو گیان بوو، دەڵێ: - لەمەککە - دەرچووم، هاتمە (مدینە)و سگم بووە ٩مانگ لە(قوباء) دابەزیم، لەوێ (عبداللە)م بوو، ئینجا هێنام بۆ - خزمەت - پێغەمبەری خوداﷺ، لەنێو کۆشیدا دامنا، داوای دەنکە خورمایەکی کرد، خورماکەی جووی، تفی کردە نێو دەمیی، یەکەم شتێك چووە نێو مەناوی تفی پێغەمبەری خودا بووﷺ، ئینجا خورما جوراوەکەی خستە بن مەلاشوی، بۆی پاڕایەوە، داوای بەرەکەتی بۆ کرد، یەکەم منداڵ بوو لە دەوڵەتی مدینەی ئیسلامدا لەدایکبو، موسڵمانان زۆر دڵخۆش وشادومان بوون، چونکە پێیان گوترابوو: جوو

---

١ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٦٣) .

جادویان لێکردوون ومندالّتان نابن[١]. ناوی لێنا (عبدالله) دوای ئەوە تەمەنی گەیشتە ٧یان٨ ساڵ، بەفەرمانی (زوبێر)ی باوکی ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺو بەیعەتی پێدا، پێغەمبەرﷺ کەبینی بەرەو ڕووی - پێرۆزی - دێت زەردەخەنەی هات، ئەو دوای گەیشتنی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ مەدینە یەکەمین لەدایکبوی ئیسلام بوو، جوو گوتبویان: بەستومانن و لە(مدینە)دا نێرەوەزیان لێ ناکەوێتەوە، کاتێك (عبدالله) لەدایکبوو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوداﷺ - بەیەکدەنگ - (الله أکبر)یان کرد[٢]، بۆ زیاتر دەنگدانەوەی لەدایکبونی وپوچەڵ کردنەوەی دەنگۆی جووەکان، ئەبوبەکری صدیق ﷺ بە (مدینە)یدا گێڕا[٣]، ئەمە شێوە ڕاگەیاندنێکی کرداری بوو بۆ بنبڕکردنی هەموو ئەو پڕوپاگەندانەی جوو لەشاری مدینەدا ڕەواجیان پێدابوو، ئیبن زوبێر بەحوکمی خزمایەتی بەزۆری لەخزمەت پێغەمبەری خودا بووﷺ، زۆر هاموشۆی ماڵی عائیشە ی پووری و هاوسەری پێغەمبەری خودای دەکرد ﷺ.[٤]

## سێهەم: ( زوبێری کوڕی عەووام )ی باوکی عبدالله ﷺ:

ئەبو عبدالله، زوبێری کوڕی عەووامی کوڕی خووەیلیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی عبدالعربی ی کوڕی قوسەی ی کوڕی کیلابی قوڕەیشی ئەسەدی یە [٥]، لە(قوسەی)دا لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ یەکدەگرنەوە، دڵسۆز (حواري) و پورزای پێغەمبەری خودابووﷺ، (صەفیەی کچی عەبولموتتەلیب) دایکیەتی، یەك لەدەشایەتی بۆ دراوەکانی بەهەشتە، یەکێکە لەهاوەڵانی شورا[٦]، بەتازەلاوی ولەتەمەنی شازدە ساڵیدا موسڵمان بوو[٧]، هەر جەنگێك پێغەمبەری خوداﷺ ڕاپەڕاندبێ لێ ی دوانەکەوتووە[٨]، دوای موسڵمان بوو تووشی ئازارو ئەشکەنجە بووە، گێڕدراوەتەوە:

---

١ـ البخاري رقم ٥٤٦٩، اليهود في السنة المطهرة (٢٦٥/١) .
٢ـ الحاكم (٥٤٨/٣) .
٣ـ البداية والنهاية (١٨٨/١١) .
٤ـ سير أعلام النبلاء (٣٦٣/٣) .
٥ـ الأصابة (٥٢٦/١ـ ٥٢٨) .
٦ـ الطبقات (١٠٠/٣) .
٧ـ سير أعلام البنلاء (٤١/١) .
٨ـ سير السلف (٢٢٦/١) .

مامی پارچە حەسیرێکی تێوە دەپێچاوە ئاگری دەکردەوەو بەدوکەڵەکەی قانگی دەداو دەیگوت: بگەڕێوە بۆ سەر کوفر، زوبێر دەیگوت: نا، هەرگیز کافر نابم.[١]

پێغەمبەری خوداﷺ لە بارەیەوە فەرمویەتی: ((إن لكل بني حواري، وحواري الزبير))[٢]. واتە: ئەو لەنێو هاوەڵانمدا تایبەت بەخۆمەوە سەرخەرمە، لەم بابەتە بەهاوەڵانی عیسی - علیه السلام - دەگوترێ: (الحواريون) واتە: دڵسۆزو پشتیوانانی، (حواري) پشتیوانی دڵسۆزە، فەرمودەکە ئەم پلەوپایە بەرزە لەخۆ دەگرێت وزوبێریﷺ بێ لەغەیری خۆی جواد دەکاتەوە، لەبەر ئەمە عبداللەی کوری عمرﷺ، گوێ ی لەیەکێك بوو دەیگوت: من کوری (حواري) یەکەم، گوتی: ئەگەر کوری زوبێربی وایە، دەنا وانیە.[٣]

زوبێری کوری عەووام: لەسەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ پیاوی راپەڕاندنی کارە گرنگ وگرانەکان بوو، لەسەردەمی ڕاشیدیندا یەك لەپایە ڕاگرەکانی دەوڵەت بوو وبەشداری لەفتوحاتە گەورەکاندا کردووە[٤]، عومەری کوری خەتتاب ﷺ لەسەردەمی خۆیدا - پۆستی - ویلایەتی مصری بۆ پێشنیار دەکا، زوبێر دەڵێ: پێویستیم پێ ی نیە، بەڵام بە موجاهیدی دەردەچم و هاریکارو دەستباریش دەبم بۆ موسڵمانان، ئەگەر (عەمری کوری عاص)م بینی وفەتحی کرد، دەست ناخەمە کاریەوەو دەچمە کەنار دەریایەك و سەنگەرنشینی تێدا دەکەم، ئەگەر بینیم لەجیهاد دایە لەگەڵیدا دەبم[٥]، لەکتێبی (أمير المؤمنين علي ابن أبی طالب)دا قسەم لەسەر ژیاننامەی کردووە، (کێ زیاتری لەم بارە دەوێ) با بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە.[٦]

---

١ـ الطبراني في الكبير (١/١٢٢) .
٢ـ مسلم رقم ٢٤١٤ .
٣ـ مصنف بن أبي شيبة رقم ١٢٢١٩ صحيح .
٤ـ سيرة أمير المؤمنين علي ابن أبی طالب ص٥٤١ .
٥ـ فتوح البلدان ص٢٩٩، نظام الحكم للقاسمي (١/٥٤٤) .
٦ـ سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب ص ٥٢٥ـ٥٥٠ .

## چوارەم: ( ئەسمائەی کچی صدیق )ی دایکی عبداللەی کوڕی زوبێر ﷺ:

ئەسمائەی کچی عبداللەی کوڕی ئەبی قوصافەی کوڕی عوسمانی کوڕی عامری کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی تەمیمی کوڕ موڕڕەیە[1]، لەموسڵمانە یەکەمینەکانە و لەگەڵ عائیشەی خوشکی، کە ئەو کاتە عائیشە منداڵ بوو موسڵمان بوو.[2]

چەندین هەڵوێستی بەرچاوو پەرێزی پاك وستایشکراوی لەمێژووی ئیسلامی شکۆداردا باسکراوە، لەنێو ئەو هەڵوێستانەدا:

**١ـ لە کۆچی پێغەمبەرداﷺ بۆمەدینە:**

خاتو عائیشە لەفەرموودەیەکی درێژی دا دەڵێ: دەمی نیوەڕۆ بوو لەماڵی ئەبوبەکر دانیشتبووین، یەکێك بەئەبو بەکری گوت: ئەوە پێغەمبەری خوایەو دەمامکی کردووە !، کاتێك بوو - پێغەمبەرﷺ - لەوکاتەدا نەدەهاتە ماڵمان، ئەبوبەکر گوتی: باب ودایکمی بەقوربان بێ، بەخوا کارێکی گرنگ لەم کاتەدا هێناویەتی....

تائەوەی - عائیشە- دەڵێ: بەپەلە بارگەمان بۆ ساز کردن وخۆراکمان ئامادەکردو خستمانە تورەگەوە، ئەسمائەی کچی ئەبوبەکرﷺ پارچەیەکی لەپشتێنەکەی بڕی وسەری تورەگەکەی پێ گرێدا، بەمە ناوی (خاوەن دوو پشتێن)ی لێنرا.[3]

خاتو ئەسماء هاریکاریەکی باشی پێغەمبەرﷺو هاوەڵەکەی کرد لەبردنی ئاوو خۆراك بۆیان لەنێو ئەشکەوتەکەدا، ئازارو ئەشکەنجەیەکی کەم وێنەشی چەشت لەڕێگەی خودادا، دەربارەی ئەمە - ئەسماء - بۆ خۆی دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری

---

١ـ الطبقات الكبرى (١١٩/٣) .

٢ـ السيرة النبوية (٢٧١/١)، عبداللەى بن الزبير، للناطور ص١٧ .

٣ـ البخاري رقم ٣٩٠٥، السيرة النبوية للصلابي (٤٦٣/١) .

خوداﷺو ئەبوبەکرﷺ دەرچوون، تاقمێکی قورەیش - کەئەبو جەهلی کوڕی هشامیان لەنێو دابوو - هاتنە لامان، لەبەر دەرگای ماڵی ئەبوبەکر ڕاوەستان، منیش لێیان چوومە دەرەوە، گوتیان: هۆکیژی ئەبوبەکر، بابت کوا ؟

دەڵێ گوتم: بەخوا نازانم بابم لەکوێ یە.

ئەبو جەهل - کەڕقی هەستابوو - دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی لەڕومەتم دا، گوارەکەم لەگوێ دەرپەڕی! ئەسماء دەڵێ: ئینجا ڕۆیشتن.[1]

ئەمە وانەی یەکەمە لەلایەن ئەسمائی دایکی عبداللەی کوڕی زوبێر ﷺ، ئافرەتانی موسڵمان نەوە لەدوای نەوە فێری دەبن وڕەوانی دەکەن، فێر دەبن چۆن نهێنی موسڵمانان لەدوژمنەکانیان دەشارنەوەو چۆن خۆڕاگرانەو سەربەرزانە لەبەرامبەر هێزی زوڵم و زۆردا دەوەستنەوە.

وانەی دووەمی ئەسماء، کەزۆر کاریگەرە، ئەمەیە:

کاتێك ئەبو قوحافەی باپیری دەچێتە ماڵیان، کە نابینایە دەڵێ: بەخوا پێم وایە ئەبو بەکر ئێوەی لەخۆشی و لە ماڵەکەشی کردبن.

ئەسماء دەڵێ: نانەخێر بابە گەورە! باوکم ماڵێکی زۆری بۆ بەجێهێشتوین، دەڵێ: هەندێك بەردوچکەم لەتورەکەیەك کردن وخستمە نێو ئەو تاقەوە، کە ئەبوبەکر پارەی خۆی تێدا دادەنا وپۆشاکێکم بەسەردادا ودەستی باپیرم گرت وگوتم: دەستت بخەسەر ئەو پارەو سامانە.

دەڵێ: دەستی بەسەردا گێڕاو گوتی: قەیدی نیە، مادام ئەمەی بۆ بەجێهێشتوون، کارێکی باشی کردووە، ماوەیەکی پێ بەڕێ دەکەن.

ئەسماء دەڵێ: نا، بەخوا بابم هیچی بۆ بەجێ نەهێشتبوین، بەڵام ویستم بەم کارەم ئەم پیرە ئارام بکەمەوە.[2]

ئەسماء: بەزیرەکی و لێزانی خۆی توانی نهێنی باوکی پەردە پۆش بکات وئارامی وئۆخەی یش بخاتە نێو دڵی باپیریەوە، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی درۆ بکات!!

---

١ـ تأريخ الطبري (٢/٣٧٩،٣٨٠) . السيرة النبوية لابن هشام (٢/١٣١،١٣٢) .

٢ـ السيرة النبوية لابن هشام (٢/١٠٢)، اسناده صحيح .

چـونکە بـاوکی هـەقی بـۆ بەجێهێـشتبوون، ئـەو بەردانـەش کـۆی کردبوونـەوە بەمەبەستی دڵنیا کردنی پیرە پیاوەکە بوو، هەروەها بـاوکی (ئیمـان بـەخودا)ی بـۆ بەجێهێشتبوون، کەبەچـیاکان نالـەرزێت وبەڕەشـەبا ناجوڵێـت وبـەبوون ونـەبوونی سامان کاری تێناکرێت.

هەروەها باوکی: باوەڕ بـەخۆ بـوون وهیممـەتی بـەرزی لـە دڵ ودەرونـی ئەوانـدا بەجێهێشتبوو، ئەمـە وایکـرد لـەوان بایـەخ بـەکارە بـەرزو گرنگـەکان بـدەن و، ئـاوڕ لەشتە بێ نرخ وکاتیەکان نەدەنەوە.

ئەبوبەکر خێزانێکی موسڵمانی نمونەیی دروستکرد، کە زەحمەتە وێنـەی دوبـارە بێتەوەو هاوشێوەی پەیدا بێتەوە.

ئەسماء ﵂ بەم هەڵوێستانەی نەخشەو پلانێکی وای بۆ کچان وژنـانی موسـڵمان کێشا، کە پێویستە لەسەریان، شوێن پێی هەڵبگرن و بیکەنە سەر مەشقی خۆیان.[1]

**٢ــ پەیوەندی(ئەسمائە ) لەگەڵ دایکی بتپەرسی:**

ئەسماء کچی ئەبوبەکر﵄ دەڵێت:

لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ دایکم، کە بت پەرست بوو هاتـە لام، منـیش پرسـم بە پێغەمبەری خودا کردﷺو گوتم: دایکـم بـەترس وتەماعـەوە(راغبـة) هاتۆتـە لام، ئایا پەیوەندی لەگەڵ بکەم و ڕووی خۆمی بدەمێ؟

فەرمووی: بەڵێ پەیوەندی لەگەڵ دایکت دا بکە.[2]

ئیبن حەجەڕ دەڵێ: سەبارەت بە(وهي راغبة) چەند ڕایەك هەیە، ڕای جـەماوەری زانایان ئەوەیە: دایکی هاتووەو داوای خێرو چاکە لە کچەکەی دەکـات و دەشترسـێ بە نائومێدی بگەڕێتەوە.

(خەتتابی) چەند سودێکی ئەم فەرموودەی باسکردوون: چۆن پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ خزمی موسڵماندا دەبەسترێ، ئاوەهاش لەڕێ ی ماڵبەخشین و

١ــ الهجرة النبوية المباركة ص ١٢٨ .

٢ــ البخاري رقم: ٢٦٢٠ .

خێرو چاکەی ترەوە پەیوەندی لەگەڵ خزمی کافردا دەبەسترێت[١]، خودای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَـٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ وَظَـٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾ الممتحنة:٨،٩. ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە ڕوخسەت و ڕێگە پێدانیان تێدایە بۆ موسڵمانان خێرو چاکە لەگەڵ ئەو جۆرە خزمە کافرانەیان دا بکەن کەشەڕیان لەگەڵ ئیسلام وئەواندا نەکردووە، ئەگەر چی دۆستایەتیش پچڕابێ.[٢]

### ٣ــ ئازایەتی وجیهادی ئەسماء لەجەنگی (یەرموك).

ئازایەتی وجیهاد ئەسماء ﷺ لەڕێ ی خودادا لەسەروی خەیاڵەوە دەخوێنرێتەوە، نموونەی ئەمە: دەرچوونی لەگەڵ سوپا بۆ جەنگی (یەرموك)و بەشداریکردنی کاریگەرو بەرچاوی لەگەڵ زوبێری هاوسەری و عبداللەی کوڕی ﷺ[٣] لەو جەنگەدا.

بەرەنگاربوونەوەی بەجەرگانەی ئەو لەدژی ئەو دزو جەردانەی ڕۆژانێك لەنێو (مدینە)دا پەیدابببوون، فاطمەی کچی مونذیر دەڵێ: لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایی سەعیدی کوڕی عاس بەسەر شاری (مدینە)، ئەسمائی کچی ئەبوبەکر خەنجەرێکی لەدژی دزەکان هەڵدەگرت، شەوانە لەژێر سەری دادەنا.[٤]

### ٤ــ ئەسماء و قورئانی پیرۆز:

ئەسماء ﷺ بە قورئان ورێنمایی یەکانی پێغەمبەر ﷺ خۆی پەروەردە کرد، فەرمو لەگەڵ ئەو وێنە پرشنگدارەی ژیانی ئەو، کە چۆن لەگەڵ قورئانی پیرۆز ئاوێتە بووە.

---

١ــ فتح الباري (٥/٢٧٧) .

٢ــ شرح منظومة الأداب (١/٢٩٧)، برالوالدين، أم حفص عبير بنت محمد ص٣٦ .

٣ــ طبقات إبن سعد (٨/٢٥٣)، أسماء بنت أبي بكر، للصبّاغ ص٣٣ .

٤ــ طبقات إبن سعد (٨/٢٥٣)، أسماء بنت أبي بكر، للصبّاغ ص٣٣ .

ڕۆژێك کوڕێکی سەردانی دەکات، تەماشا دەکات دایکی لەنوێژدایەو، ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنێ:﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾ الطور:٢٧ ، ئەسماء دەگریاو پەنا بەخودا دەگرێت لەسزای دۆزەخ، لەسەر ئەم حاڵەی بەردەوام دەبێ، ناچار کوڕەکەی دەچێتە بازاڕو ئیشەکانی جێبەجێ دەکات وئینجا دێتەوە لای، دەبینێ ئەو هەر لەحاڵەتی گریەو هەنسك دایەو پەنا بەخودا دەگرێت.[1]

کاتێك ژانە سەری دەگرت، دەستی دەخستە سەر سەری ودەیگوت: ئەمە بەهۆی تاوانمەوەیەو ئەو تاوانانەش خودا دەیانبورێ زۆرترن[2]، ئەمە تێگەیشتنێکی قووڵە لەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾ الشوری:٣٠.

(دکتۆر محمد بن لطفي الصباغ) ژیاننامەیەکی بەنرخی ئەسماء نوسیوە، لەمەولا بەئیزنی خودا لەباسی گەمارۆدانی عبداللەی کوڕی لەلایەن (حجاج)ەوە هەندێك لەوانەو بەندەکانی ئەسماء رضي الله عنها دەخەینە ڕوو.

**پێنجەم: هاوسەرەکانی و ڕۆڵەکانی ئیبن زوبێر:**

هاوسەری یەکەم: تومازەڕی کچی مەنزوری فەزاری.

ڕۆڵەکانی لەم هاوسەرەی:

خوبەیب، هەمزە، عوباد، سابت.

هاوسەری دووەم: ئوم هاشیم کچی حوللەی کوڕی مەنزور.

ڕۆڵەکانی لەم هاوسەرەی:

هاشم، قەیس، زوبێر، عورِوە ـ کەلەگەڵ بابی کوژرا ـ .

هاوسەری سێهەم: جەسیمەی کچی عبدالرحمن ی کوڕی حارسی کوڕی هیشام.

ڕۆڵەکانی لەم هاوسەرەی:

---

١ـ الحلية (٢/٥٥)، أسماء بنت أبي بكر ص٩ .

٢ـ الحلية (٢/٥٥)، أسماء بنت أبي بكر ص٣٣ .

عامر، موسا، ئوم حەکیم، فاتیمە، فاختە.

هاوسەری چوارەم: عائیشەی کچی عوسمانی کوڕی عەففان.

ڕۆڵەکانی لەم هاوسەرەی:

بەکر، ڕوقیا.

هاوسەری پێنچەم: ئوم وەلەد.

ڕۆڵەکانی لەم هاوسەرەی:

عبدالله، موسعەب.[١]

**شەشەم: شێوە ڕوخسارو گرنگترین سیفەتەکانی ئیبن زوبێر:**

ڕەنگ ئەسمەرو گەنمی ودالە گۆشت بوو، بەلام زۆر درێژ نەبوو، مووی ڕیشی تەنك ومەیلەو ڕەنگزەرد بوو، پەرستنی زۆر بوو وشوێنەواری سوژدەی لەتەوێڵی دیاربوو، زاناو موجتەهیدو زیرەك وڕەوانبێژ بوو، ڕۆژو گرو شەونوێژ کەر بوو، بەجەرگ وتۆڵەشێن بوو، سەربڵندو نەفسبەرزو بەهیممەت بوو[٢]، زاناو خودا پەرست و بەسام وسەنگ بوو، نوێژو ڕۆژوی زۆر بوو، گەردنکەچی خوداو سیاسەتمەدارێکی بەتوانا بوو.[٣]

وەك دەردەکەوێ: کاریگەری یەکی گەورە لەسەر دروستبوونی کەسایەتی ئیبن زوبێر هەبووە لەلایەن زوبێری بابی وئەسماء دایکی وعائیشەی پوری وئەبوبەکری باپیری وصەفیەی نەنکی پوری پێغەمبەری خوداﷺ - .

---

١ــ البداية والنهاية (٢١٣/١١) .

٢ــ البداية والنهاية (١٩٣/١١) .

٣ــ البداية والنهاية (٢٠٤/١١) .

## گرنگترين سيفەتەكانی ئيبن زوبێر:

**١ـ شارەزايی و زانياری:**

عبداللەی كوڕی زوبێرﷺ يەك لەچوار (عەباديلە)كانی شاری (مدينە)بوو، كە لەبوارەكانی ئاين دا شارەزا بوون، ئەوانيش: (عبداللەی كوڕی زوبێر، عبداللەی كوڕی عەبباس، عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاس، عبداللەی كوڕی عومەر ﷺ).

لە هەردوو صحيحی (بوخاری وموسليم) چەند فەرموودەيەكی لێوە گێڕدراوەتەوە، هەردوكيان لەسەر يەك فەرموودەی ڕێككەوتن، بوخاری بەتەنيا شەش فەرمودەو موسليميش دوو فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە[1]، بەمنداڵی فەرموودەی لەپێغەمبەری خوداوەﷺ دەگێڕايەوە.

هەروەهافەرموودەی گێڕاونەتەوە لە:

زوبێری باوكی وئەبوبەكری باپيری وعومەرو عوسمان ودايكی ئيمانداران عائيشەی پوری وكەسانی تريش.

تابيعی يە ناودارەكانيش فەرموودەيان لێوە گێڕاوەتەوە: وەك:

عوروەی برای وتاوسی كوڕی كيسان وعەمری كوڕی دينارو ئيبن ئەبی مەليكەو سابتی بەنانی و زۆری تريش[2]، تابڵێ ی شارەزا بووە عبدالرحمن ی كوڕی زەيدی كوڕی ئەسلەم دەڵێ: كاتێك(عەباديلە) (عبداللەی كوڕی عەبباس وعبداللەی كوڕی زوبێرو عبداللەی كوڕی عومەرو عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاس) وەفاتيان كرد، فيقهو زانياری كەوتە بەردەستی غەيرە عەرەب لەهەموو وڵاتان.[3]

ئيبن زوبێر واناسرابوو كەزانياريەكی فراوانی لە قورئان وسوننەت دا هەيە، لەزانا موجتەهيدەكان بوو، زاناو خوداپەرست بوو، لەم وەسفەدا زێدەڕۆيی نييە ! چونكە

---

١ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٦٣) .

٢ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٦٣) . عبدالله بن الزبير لمحمد عبدالرضا هادي ص٩ .

٣ـ معجم البلدان، نقلاً: عن عبدالله بن الزبير للناطور ص٣١ .

زۆر سەردانی دایکی ئیمانداران عائیشەی پوری ی دەکرد، کە عائیشە بەهەمە زاناو شارەزابوو وقسەی بۆ دەکردو فەرمودەکانی بۆ دەگێڕایەوە، لەلایەکی تریشەوە دوای پێغەمبەری خوداﷺو صدیقی بابیﷺ عبداللەی خۆشەویستترین کەس بوو بەلایەوە.

ماوەی خیلافەتی عبداللە نۆ ساڵ بوو، لەو ماوەیەدا هەشت حەجی کردووە، لەساڵی نۆ هەمدا چونکە گەمارۆدرابوو نەیتوانی حەج بکات.

جارێك ئیبن زوبێر وتاری بۆ حاجیان خوێندەوەو گوتی: ئەی حاجیەکان: پرسیارم لێبکەن؛ قورئان بەسەر ئێمەدا دابەزیوەو ئامادەی ڕونکردنەوەی بوین، یەکێك لەخەڵکی عێراق گوتی: دەمی هەمبانەکەم شل ببۆوەو مشکێك چو بۆ ناویەوە، منیش لە حاڵی ئیحرامدا کوشتم!، لە وەڵامیدا گوتی:

فاسقەکان بکوژن، کابرا گوتی: دەربارەی ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾﴾ زانیاریمان پێ بدە.

لەوەڵامیدا گوتی:

(العشر=دەشەوەکە): بریتیە لەهەشت ڕۆژو شەوی زلیحەجەو ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی قوربانی.

(الشفع=جوت): واتە کەسێك لەکۆتایی دوو ڕۆژی (أيام التشريق)دا مینا بەجێ بێلێت گوناهی ناگاتێ، کەسێکیش دوای بخات بۆ ڕۆژی سێهەم هەر گوناهی ناگاتێ.

الوتر: تاك: بریتیە لەئەم ڕۆژە ـ واتە عەرەفە ـ .

لەسەردەمی ـ خیلافەتی ـ خۆیدا دەربارەی مەناسیکی حەج لەهەموو کەس شارەزاتر بوو.[١]

عبداللەی کوڕی عەبباسﷺ دەڵێ: عبداللەی کوڕی زوبێر خوێنەری چاکی کتێبی خوداو شوێنهەڵگری دروستی سوننەتی پێغەمبەری خوداﷺ بوو، گەردنکەچی خودا بوو ولەترسی خودا لەقرچەی گەرمادا بەڕۆژو دەبوو، کوڕی (حەواری) پێغەمبەری

---

١ ـ تهذيب تأريخ إبن عساكر، نقلاً عن عبدالله بن الزبير، محمود شاكر ص٢٠٢ .

خودا بووﷺ دایکی کیژی صدیق بوو وپووریشی عائیشەی خۆشەویست وهاوسەری پێغەمبەری خودا بووﷺ، هەموو کەس ماف وئیمتیازاتی دەناسێ جگە لەکەسێك خودا چاوەکانی وبینایی دڵی کوێر کردبێتەوە.[١]

خوێندکار محمد عبدالرضا لەعێراق نامەیەکی لەسەر فیقهی عبداللەی کوڕی زوبێر نوسیوە.

**٢ـ پەرستن وپارێزگاری:**

ئیبن زوبێر پێداگیر بووە لەسەر ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوی زۆرو تەواوی جۆرەکانی پەرستن، بەڵکو ئەمە بۆتە نیشانەیەکی درەوشاوە بەکەسایەتی ئەوەوە، گێڕدراوەکان لەمبارەوە پلەی (تەواتور)یان وەرگرتووە.[٢]

موجاهید دەربارەی دەڵێ: ئەو پەرستنەی ئیبن زوبێرﷺ ئەنجامی دەدا، کەس هێزی پێ نەدەشکا[٣]، هەر ئەو دەڵێ: جارێ لافاو هەستاو ئاو دیواری کەعبەی داپۆشی، لەم حاڵەدا ئیبن زوبێر بەمە لەتەوافی دەکرد.[٤]

کاتێ دەچوو نێو نوێژەوە لەدنیا دادەبڕاو تاڵی وشیرینیەکانی لەبیر خۆی دەبردنەوە، دەگێڕنەوە: ڕۆژێك لەماڵی خۆیدا نوێژی دەکرد، مارێك لەبنمیچی خانوەکەوە بەربۆوەو لەقەدی هاشمی کوڕی هاڵا، ژنەکان قیژاندیان وئەندامانی خێزان کۆبونەوەو مارەکەیان کوشت ومنداڵەکەش ڕزگاری بوو، هەموو ئەم شتانە ڕوویانداو عبداللەش لەنوێژەکەیدا ئاوڕی نەدایەوە، تاسەلامی نەدایەوە نەیزانی چی ڕوویداوە.[٥]

سابیتی بەنانی دەربارەی دەڵێ: ئیبن زوبێر لەپشت مەقام ـ ی ئیبراهیم ـ ەوە نوێژی دەکرد، بەلایدا ڕەتدەبووم هەر دەتگوت تەختەیەکە بەرزت کردۆتەوەو لەوێ داتکوتاوە و جوڵەی لێوەنایە.[٦]

١ـ سير أعلام النبلاء (٣٦٧/٣)، البداية والنهاية (١٩١/١١) .
٢ـ عبدالله بن الزبير للخراشي ص٣٢ .
٣ـ البداية والنهاية (١٩٣/١١) .
٤ـ البداية والنهاية (١٩٣/١١) .
٥ـ البداية والنهاية (١٩٣/١١) .
٦ـ سير أعلام النبلاء (٣٦٩/٣) .

یەزیدی کوڕی ئیبراهیم لەعەمری کوڕی دینارەوە دەگێڕێتەوە: ئیبن زوبێر ـ کاتێك گەمارۆیاندا بوو ـ لەحیجری ئیسماعیل ـ دا نوێژی دەکرد، بەردو ئاگری مەنجەنیقی بەردەکەوت وئاوڕی نەدەدایەوە.[١]

ئیبن ئەبی مەلیکە دەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی گوتم: سەبارەت بەئیبن زوبێر شتێك لەدڵی تۆدا هەیە. گوتم: ئەگەر دەتدی نوێژ خوێن ونزاکۆیەکی وێنەی ئەوت نەدەدی.[٢]

دیسان دەڵێ: ئیبن زوبێر حەوت ڕۆژ لەسەریەك وبێ پسانەوە بەڕۆژو دەبوو، لەحەوتەم ڕۆژدا لەهەمومان بەهێزتر بوو[٣]. زەهەبی سەبارەت بەمە دەڵێ: لەوانەیە هەواڵی قەدەغەکرانی ڕۆژوی ویساڵ - بێ پسانەوە- لەلایەن پێغەمبەری خوداوەﷺ بەئیبن زوبێر نەگەیشتبێ؛ چونکە پێغەمبەرﷺ بەبەزەیی وبەپەرۆشە بۆ ئیمانداران، هەرکەسێك ئەمە بکات وزێدەڕۆیی لە خۆ برسی کردن و تینو کردنی خۆی بکات مەزاجی دەروونی تێك دەچێت ولاشەی بێ هێز دەبێت، کەواتە شوێنکەوتنی سوننەت لەپێشترە، بەڵام ئیبن زوبێر لەگەڵ دەستڕۆیشتن ودەسەڵاتیشیدا نمونە بوو لەخودا پەرستی دا.[٤]

**٣ــ بوێری وئازایەتی:**

عبداللەی کوڕی زوبێر لەزەمەنی خۆیدا سوارچاکی قورەیش بوو، لەتەمەنی حەفتاساڵیدا شیری بەدەستی دەگرت دەتگوت ئێستا بەهاری تەمەنیەتی، عوسمانی کوڕی تەڵحە دەڵێ: ئیبن زوبێر لەسێ شتدا کێبەرکێی لە گەڵ نەدەکرا: (ئازایەتی، بەندایەتی، ڕەوانبێژی).[٥]

هیشامی کوڕی عوروە دەڵێ: عبداللەی مامم بەمنداڵی زمانی بەوشەی (سیف=شیر) پژاوەو لێکدا لێکدا گوتویەتیەوە، کاتێك باوکی گوێ ی لێ دەبێ

١ــ سیر أعلام النبلاء (٣/٣٦٩) .
٢ــ هەمان سەرچاوە (٣/٣٦٩) .
٣ــ هەمان سەرچاوە (٣/٣٦٩) .
٤ــ هەمان سەرچاوە (٣/٣٦٨) .
٥ــ هەمان سەرچاوە (٣/٣٧٠) .

دەڵێ: بەخودا ڕۆژگارێك بەدەستیەوە دەگری.[١]

لەقۆناغی منداڵیەوە شایەتی ئازایەتی بۆ دراوە، لەشوێنی خۆیدا دەیخەینە ڕوو، لەجەنگی یەرموك وگەمارۆی قوستەنتینیەو فەتح کردنی ئەفریقیاو بەرگریکردنی لەعوسمان لەڕۆژی گەمارۆدرانیداو جەنگی جەمەل و بەتایبەتیش ئەو هەموو ئازایەتی ونەبەردیەی نواندی لەبەرامبەر(حجاج)و سوپاکەی لەکاتی دووەم گەمارۆدرانیدا لە(مەککە).

عبدالله دەیگوت: بەخوا: ئەگەر٣٠٠ سێسەد کەسی وەك خۆم خۆڕاگرم لەگەڵ بێت باکم نیە ئەگەر هەموو خەڵکی سەر زەویم بەسەر بکەن.[٢]

خۆ لەئازایەتی دا بەوێنە دەهێنرێتەوە.[٣]

لەم سیفەتەشیدا کاریگەری باوکی وصدیقی باپیری ودایکی وخاڵەکانی لەسەربوو، لەسەروی هەمووشیانەوە ئازایەتی وبەجەرگی عبدالرحمن ی کوڕی صدیق ورەی زیاتری بەبەر عبدالله داکردبوو.

**٤ـ زمانپاراوی و وتاربێژی:**

ئیبن زوبێر لەم بوارەشدا کێبەرکێ ی لەگەڵ نەدەکرا، ئەو لەڕیزی ئەو وتاربێژانەی قورەیش بووکە لەژمارەی پەنجەکان تێپەڕیان نەدەکرد، لەوتاردانیدا (لەجوڵەو ئاماژەو نۆتەی دەنگەکانیدا) بە ئەبوبەکری باپیری‌ﷺ دەچوو، دەنگێکی دلێری هەبوو.

دەگێڕنەوە: کاتێك موسڵمانەکان بەسەر (بەربەر)دا سەرکەوتن وخەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن وسامانێکی زۆریان بە غەنیمەت گرت، ئیبن زوبێر بەهاوەڵایەتی ئیبن ئەبی سەرح بەموژدەدەر بۆلای عوسمان‌ﷺ بەڕێکرایەوە بۆ مەدینە، عوسمان پێ ی گوت: ئەگەر دەتوانی ئەم موژدە هەواڵە لەسەر (مینبەر) بەخەڵك ڕابگەیەنە، گوتی: بەڵێ ئیبن زوبێر چووە سەر مینبەر وڕوداوەکەی بۆ باسکردن، عبدالله

---

١ـ عبدالله بن الزبير فقيهاً ص١٤، البداية والنهاية (٢٠٨/١١) .

٢ـ سير أعلام النبلاء (٣٧٦/٣) .

٣ـ سير أعلام النبلاء (٣٧٧/٣) .

دەڵێ: لام كردەوە و تەماشام كر زوبێری بابم لەنێو ئامادەبواندایە، كەدەموچاوی ئەوم دی سام وهەیبەت گرتمی وخەریك بوو زمانم لاڵ بێ، تێم گەیشت بەچاوی ئامازەی پێكردم وهانیدام بەردەوام بم، منیش ئاسایی بوومەوەو بەردەوام بووم تاكۆتایی، كەدابەزیم گوتی: رۆڵەگیان، كەگوێبیستی وتارەكەت بووم وامدەزانی گوێم لە ئەبوبەكری صدیق بوو وتاردەدا.[1]

محمدی كوری عبداللەی سەقەفی دەڵێ:

لە وەرزی حەجدا، رۆژێك پێش تەرویە. ئیبن زوبێرم بینی بە بەرگی ئیحرامەوە هاتە لامان، بەدەنگێكی بەرزو خۆش تەلبیەی كرد كەتا ئەودەمە بەمشێوەیە لەكەسم نەبیستوو، ئینجا دوای سوپاس وستایشكردنی خودا جل جلالە، گوتی: بەڵام دوای ئەمە: ئێوە لەئاسۆ دوورەكانەوە بەمیوانی هاتوون بۆ لای خودای گەورە، خودای گەورە مافی خۆیەتی رێز لەمیوانەكانی بگرێت، هەركەسێك داوای شتێك بكات كەلای خودایە ئەوا سواڵكەری بەر دەرگای خودا نائومێد نابێت، راستی قسەو وتارتان بەكردەوەو كردارتان بسەلمێنن، بزانن دەستبێنی قسەكانتان كردارتانە، ئاگاتان لەنیازو نیەتتان بێ، دڵتان، دڵتان، ئاگاتان لەدڵتان بێ، خودا، خودا، ئاگاتان لەخودا بێ پارێزگاری خودا بكەن لەم رۆژانەتاندا، ئەم رۆژانە رۆژانێكن تاوانەكانیان تێدا دەسرێنەوە، لەئاسۆ دوورەكانەوە بۆ ئێرە هاتوون، بۆ بازرگانی نەهاتوون، بۆ دەستخستنی ماڵ ودنیا نەهاتوونەتە ئێرە، ئینجا (تلبیة)ی كردو خەڵك بۆیان ستاندەوە، رۆژێكم نەبینیوە وەك ئەو رۆژە خەڵك تێیدا گریابێت.[2]

لە ئیسلامدا ئەمانە بوون: معاویەو كورەكەی، سعیدو كورەكەی، عبداللەی كوری زوبێر.[3]

---

١ـ البداية والنهاية (١١/١٩٤) .

٢ـ البداية والنهاية (١١/٢١٨) .

٣ـ تأريخ إبن عساكر، نقلا عن عبدالله بن الزبير، للخراشي ص٣٤ .

## لە وتارە بەناوبانگەکانی:

وتارێکی بەبۆنەی شەهیدبوونی حوسێنﷺ بۆ دانیشتوانی مەککە.
وتارێکی بۆ خەواریج لەکاتی ئاخاوتنیاندا.
وتارێکی بەبۆنەی کوژرانی موسعەبی برای لەعێراق.[1]
لەئامۆژگاریە بەناوبانگەکانی:

ئەو ئامۆژگاریەیە کە وەهەبی کوڕی کیسان نوسیویەتیەوە، وەهەب دەڵێ: عبداللەی کوڕی زوبێر بۆمنی نوسیوە: خەڵکی پارێزگار چەند نیشانەیەکیان هەیە، بەونیشانانە دەناسرێن وخۆشیان لەخۆیاندا هەستی پێ دەکەن: ڕاستی لەقسە کردندا، دانەوەی سپاردە، قوتدانەوەی ڕك وتوڕەیی، خۆڕاگری لەبەرامبەر موسیبەتدا، ڕازی بوون بەقەزاو بڕیاری خودا، سوپاسگوزاری لەسەر نازو نیعمەت، گەردنکەچی بۆ حوکمی قورئان، ڕۆژەکان وەك بازاڕن، ئەوەی لەڕێیدا دادەنرێ، هاوتاکەی لەبەرامبەریدا هەڵدەگیرێ، بەخشینی هەق هەلگری خۆی هەیەو ئەهلەکەی بۆی دێن، بەخشینی پووچیش بەرامبەری خۆی هەیە، ئەهلی خۆی بۆی دێن.[2]

بێگومان سیفەتی وتاربێژی وتوانای قەناعەت پێدان بۆ هەموو سەرکردەیەك پێویستە، ئیبن زوبێر لەم بوارەدا پێشەنگ بوو، زمانپاراوی و وتاربێژیەکەی یەك لەهۆکارە کاریگەرەکانی بڵاو کردنەوەی بانگەشەکەی و ئەو ڕەوشتانەی ئەو باوەڕی پێهەبوو لەژیانیدا.

### ٥ــ سەخاوەت و دڵاوایی:

عبداللەی کوڕی زوبێر بەخشندە بوو و مافی جەماوەری بەتەواوەتی دەدا، کەسێك مستەحق بوایە زیاتری - لەمافی خۆی - پێ دەدا، بەڕێگای مەشروع

١ــ الكامل في التأريخ (٣/٥٨) .
٢ــ البداية والنهاية (١١/٢١٩) .

نەبوایە نەیدەبەخشی؛ خەڵکانێك تۆمەتی چروکی وڕژدی یان داوەتە پاڵ ؛ چونکە نەیداوەتە کەسانی نەشیاوو بەڕاست وچەپیدا زێدەڕۆیی تێدا نەکردووە، ماڵی موسڵمانانی بە دیاری نەداوەتە شاعیرو زمان لوس وخۆڕەپێشکەران، کە بەزۆری لەڕێی ئەم جۆرە کەسانەوە دەنگۆیەکان بڵاودەبنەوە، بەلام ئیبن زوبێر بەرامبەر ئەم دەنگۆو درۆدەلەسانە بێ باك بووەو گوێ ی نەداونێ مادام ئەو لەسەر ڕاستە ڕێ یە.[1]

بەداخەوە زۆر لێکۆڵەر ئەم ڕیوایەتە نادروستەیان لەدوژمنانی ئیبن زوبێرەوە وەرگرتووەو نەهاتوون هەموو ئەو ڕیوایەتە ڕاست و سەحیحانەی دەربارەی سەخاوەت ودڵاوایی ئەو هەن بنوسنەوە، بێگومان پەردە پۆشکردنی حەقیقەتی کەسایەتیەکی وەك ئیبن زوبێر کارێکی خراپەو بەبێ ویژدانی دادەنرێ.[2]

دیارە وەسف کردنی ئیبن زوبێر بەچروکی وڕژدی خۆی لەخۆیدا وەسفێکی باشە بۆ ئەوو نەك لەکەداری ناکات بەڵکو پایەرزتری دەکات ؛چونکە شوێنپێ ی خەلیفە ڕاشیدەکانی هەلگرتووە وسیاسەتی ئەوانیش دەربارەی بەیتولمال سیاسەتێکی توندو تۆڵ بووە، لەلایەکی ترەوە ئەو خۆی بەخاوەنی بەیتولمال نەزانیوەو پێی وابووە هەموو موسڵمانان خاوەنینە ؛ بۆیە ئەو تەنها لەتوانایدابووە لەڕێگای مشروع دا بیبەخشێ.[3]

پێ دەچێ ئەوانە هاتبن سیاسەتی دارایی ئیبن زوبێریان بەرامبەر کردبێ بەسیاسەتی دارایی ئومەویەکان، ئومەویەکان ماڵ و پارەیان کردبووە هۆکاری ڕاکێشانی هەرچی لایەنگرو پشتیوانی شاعیری وزیاتر بۆ خۆیان، بەلام ئیبن زوبێر ئەم کارەی نەکردووە و بەڕەوای نەزانیوە بۆ حیسابی خۆی پارەو سامانی موسڵمانان خەرج بکات؛ بۆیە دەبینین کەسیفەتی ڕژدی دەدرێتە پاڵ ئیبن زوبێر، لەڕاستی دا بەڵگەیە لەسەر پارێزگاری و بەخشندەیی ئەو وپێداگیری ئەو لەسەر پاراستنی ماڵی گشتی موسڵمانان.

---

١ــ عبدالله بن الزبیر، محمود شاکر ص٢ .

٢ــ هەمان سەرچاوە ص ٣٦ .

٣ــ هەمان سەرچاوە ص٣٧ .

## چەند شايەدی يەك لەسەر سەخاوەتی ئيبن زوبێر:

**أ ـ شايەدی عائيشه‌ﷺ:**

عائيشەی كچی تەڵحە دەڵێ: لەگەڵ دايكی ئيمانداران عائيشەی پورم چوومە دەرەوە، بينيمان (راجين) دەڵێ:

أنـشد مــن كــان يعيــد الهــم
يــدلني اليــوم علــى إيــن أم
لــــة أب في بــــاذخ أســـــم
وأمـــــة كالبـــــدر ليـــل تم
مقابــل الحنـــال كـــريم العـــم
حـــرّعـــة أكـــؤســـــه بـســـمّ

دەڵێ: كەدايكی ئيماندارانی گوێ ی لەم هۆنراوەی بوو، بانگی كردو لەژێر بەچەكەيەوە پێ ی گوت:

هۆ بەندەی خودا، لەپێغەمبەری خوداﷺم بيستووە دەيفەرموو: (الدّال على الخير كفاعلە) ڕێنيشاندەری كاری چاك وەك بكەرەكەيەتی، بۆ جێبەجێكردنی پێويستيەكەت بچۆلای عبداللەی كوڕی زوبێر، ئەويش ڕۆيشت تاگەيشتە لای، (عبدالله)ش وڵاخێك و بارێكی خواردن پێدا.[1]

**ب ـ شايەدی معاويەی كوڕی ئەبو سوفيانﷺ:**

معاويەﷺ گوێ ی لەپياوێك بوو دەيگوت:

إبـــن رقـــاش ماجـــد سميـــدع
يأتـي فيعطـي عـــن يـد أويمنـــع

١ـ تأريخ دمشق الكبير (١٤٧/٣٠) .

گوتی: ئەو کەسە عبداللەی کوڕی زوبێرە.[1]

**ج ـ نابیغەی کوڕی جەعدەو عبداللەی کوڕی زوبێر:**

عبداللەی کوڕی عورِوە گوتی: گرانی و نەهاتی سەری نابیغەی کوڕی جەعدەی هەڵگرت لەدەشتەوە بۆشار، هاتە مەککەو لەمزگەوتی (حەرام) خۆی گەیاندە عبداللەی کوڕی زوبێرو پێ ی هەڵگوت:

حكيت لنا الصديق لما وليتنا وعثمان والفاروق فارتاح معدم
وسويت بين الناس في الحق فعاد صباحاً حالك اللون مظلم
أتاك أبو ليلى يجوب به الدجى دجى الليل جواب الفلاة عثمثم
لتجبر منه جانباً دعدعت به صُروف الليالي والزمان

ئیبن زوبێر گوتی: ئەبو لەیلا لەسەر خۆبە، شیعر سوک وسادەترین ئامرازی تۆیە بەلای ئێمەوە، بەڵام تۆ دوو مافت لەماڵی خودادا هەیە: مافێکیان بەهۆی بینینی پێغەمبەری خوداوەﷺ، مافەکەی تریشت بەهۆی بەشداربوونت لەگەڵ موسڵمانان لەماڵیاندا واتە ماڵی گشتی، ئینجا دەستی گرت وبردیە نێو تەویلەو حەوت وشتری بارهەڵگرو وشترێکی سواری پێدا، هەموو وشترەکانی بۆ بارکردن لەدانەوێڵەو خورماو پۆشاك، نابیغە بەهەڵەداوان چنگی لەخواردن نابوو و دەیخوارد، ئیبن زوبێر گوتی: وەیش ئەبو لەیلا چەندەی تین بۆ هاتووە!.[2]

ئەم هەواڵە هەموو ئەو گێڕدراوانە پوچ دەکاتەوە کەباس لەچروکی ئیبن زوبێر دەکەن، بەپێ ی ئەم هەواڵە:

ئەو ڕژدی وپارێزگاریکردنی ماڵی موسڵمانانی لێك جودا کردۆتەوە، لەلایەکی ترەوە پاساوی پێدانی ماڵی بەنابیغەی ڕوون کردەوەو هیچ سەنگێکی بۆ شیعرە ستایشئامێزەکەی دانەنا.[3]

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ تأريخ دمشق (١٤٦/٣٠) .

٣ـ موقف الشعر من الحركة الزبيرية ص٤٧ .

**د ــ عبداللەی کوڕی عوروەی برازای ئیبن زوبێر:**

لەسەر گوزەشتەیەکدا کە(زوبێری کوڕی بکار) گێڕاویەتیەوە هاتووە: عبداللەی کوڕی زوبێر (ئوم حەکیمی)ی کچی لە(عبداللەی کوڕی عوروە)ی برازای مارە دەکا، (عوروە) بیست هەزار درەم بۆ عبداللەی برای دەنێرێ، ئەویش ڕەتی دەکاتەوەو دەڵێ: ئەگەر ماڵم بویستایە لای خەڵکی تر دەستم دەکەوت.[1]

**ه ــ حەمزەی کوڕی عبداللەی کوڕی زوبێر لەزیندانی باوکیدا:**

حەمزەی کوڕی عبداللە دوای لەسەر کار لابرانی لەعێراق دێتە لای باوکی، کاتێك باوکی پرسیاری ماڵوپارەی ئەوێ ی لێ دەکا ئەویش دەڵێ: بەسەر خزم وکەس خۆماندا دابەشم کردووە، ئیبن زوبێر دەڵێ: ماڵێکە نەهی تۆیە، نەهی باوکتە، ئینجا زیندانی کرد.[2]

بەم شێوەیە دەرکەوت: ئیبن زوبێر بەخەم پاراستنی سامانی گشتی یەوە بووە، بەخشینیشی بەدەستی ئەو لەسنووری شەرعی خودا دەرنەچووە.

---

١ــ جهرة نسب قريش ص٢٦٥ .

٢ــ هەمان سەرچاوە ص٤٠ .

# بەشی دووەم

## عبداللەی كوڕی زوبێر لە سەردەمی ئەبوبەكر و عومەرو عوسمان و عەلی ومعاویەدا

### ١ ــ لەیەڕموك:

هەر چەندە لەگەڵ باوكیدا ئامادەی جەنگی (ئەحزاب)و (فـەتحی مەككـە)بـووە، بەڵام كتێبەكانی (سـيرة) نـاوی (عبداللـەی كـوڕی زوبێـر)یـان كـەم وزۆر نـەهێناوە؛ چونكە ئەو منداڵكار بـووەو كاتێك پێغەمبـەری خـوداﷺ وەفـاتی كـردووە تەمـەنی لـەیازدە سـاڵ تێپـەڕی نـەكردووە، خـۆ پێغەمبـەرﷺ ڕێگـەی بەمنـداڵێك نـەداوە بەشداری جەنگ بكات تەمەنی نەگەیشتبێتە پازدە ساڵ.

یەكەمین هەواڵ دەربارەی بەشداری عبدالله لە ئامـادەبوونی جەنگدا: ئەمەیـە! ئەو بەهاوڕێ یەتی بـاوكی ئامـادەی فـەتحی شـام وجـەنگی یـەڕموك بـووە، عبداللـە دەڵێ: من لەگەڵ باوكم چووم بۆ جەنگی یەڕموك، موسڵمانەكان خۆیان ئامادە بـاش كرد، (زوبێر) خۆی زرێپۆش كـردو شـیرو تـیرو كـەوان وقـەڵغانی هـەڵگرت و سـواری ئەسپەكەی بوو، ئینجا بەدوو نۆكەرەكەی گوت: عبدالله بـچووكە، لای خۆتـان لـەكن كەلوپەلەكە بەندی بكەن.[١]

دوای تـەواو بـوونی جـەنگ وسـەركەوتنی موسـڵمانان، عبداللـە بەشـداری دەرمانكردنی بریندارەكانی كرد.[٢]

ئەگەر چی عبدالله بەهۆی منداڵی بونیەوە بەشداری جەنگی نەكرد، بـەڵام بەمـە لەسەر جەنگ وتێكچڕژان و بریقەری شیرو - ڕژانی خوێن - ڕاهات وهـەر لەمنـداڵی ڕا فێری ئازایەتی وشارەزایی نێو جەنگ بوو.[٣]

---

١ــ تأريخ الطبري، نقلاً عن عبدالله بن الزبير، ماجد لحام ص٤١ .

٢ــ تأريخ إبن عساكر عن عبدالله بن الزبير، ص٤١ .

٣ــ عبدالله بن الزبير ص٤١ .

## ٢ ـ ئیبن زوبێر لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب:

ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب بەکۆڵانێکدا تێدەپەڕیّ، عبداللەی کوڕی زوبێر لەگەڵ هاوڕیّ منداڵەکانی، کە لەو کۆڵانە گەمە دەکات، منداڵەکان بەبینینی عومەر ڕایانکرد، ئیبن زوبێر لەشوێنی خۆی ڕاوەستا، عومەری پیّ ی گوت: چۆن بوو لەگەڵ ئەوانە ڕات نەکرد؟گوتی: تاوانم مەکردووە تا لێت بترسم، ڕێگاش تەنگەبەر نەبوو تا بۆت چۆڵ بکەم!.[١]

سەرچاوەکانی مێژوو سەر گوزەشتەیەکی تر دەگێڕنەوە: کە ئازایەتی عبداللە لەقۆناغی منداڵیەوە زیاتر دەردەخات، کەمنداڵ دەبیّ ڕۆژێك لەگەڵ مندالآن گەمە دەکات، پیاوێك بەلایاندا دەڕوات و بەسەریاندا دەقیژێنیّ، منداڵەکان ڕادەکەن، ئیبن زوبێر دەکشێتەوەو بانگیان دەکات: بمکەنە میری خۆتان بەرەنگاری دەبینەوە، ئەوانیشی گەڕانەوەو وایان کرد.[٢]

## ٣ ـ نووسینەوەی پەڕاوگەکانی قورئان لەسەردەمی عوسماندا:

ئەنەس دەگێڕێتەوە: عوسمان فەرمانی دا بەسەر: (زەیدو ئیبن زوبێرو سەعیدی کوڕی عاس وعبدالرحمن ی کوڕی حارس کوڕی هیشام) تا پەڕاوە نوسراوەکانی قورئانی پیرۆز بنووسنەوە، ئەوانیش نووسیاننەوە، عوسمان گوتی: ئەگەر ئێوەو زەید لەشتێکدا جیاوازبوون، بەزاراوی قورەیش بینووسنەوە؛ چونکە بەم شێوەزارە دابەزێنراوە.[٣]

کیّ زیاتری دەویّ لەمبارەوە باکتێبی (عن عثمان بن عفان) بخوێنێتەوە.

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/٧٥) .

٢ـ نفس المصدر السابق .

٣ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٧٠) .

## ٤ ـ جیهاد و تێكۆشانی لەباكوری ئەفریقیا لەسەردەمی عوسماندا ﷺ:

عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ سەبارەت بەو سوپایەی بەرەو باكوری ئەفریقیای ناردبوو بێ هەواڵ بوو؛ بۆیە عبداللەی كوڕی زوبێری بەتاقمێكەوە بەرەو ئەوێ نارد، عبدالله وتاقمەكەی بەگورجی خۆیان گەیاندە سوپاكەو لایان مانەوە، بەگەیشتنیان دەنگی (الله أكبر) لەنێو سوپاكەدا بەرزبۆوە، (جەرجیر)ی سەرۆكی كافرەكان، گوتی: ئەم دەنگە چی یە؟ گوتیان: هێزیان بەفریا هاتووە، بەمە دەستی شل بوو وئەژنۆی شكا، عبداللە تەماشای كرد ڕۆژانە جەنگ لەبەرەبەیانیدا دەست پێ دەكات و لەگەڵ نیوەڕۆ سوپای ئیسلام وڕۆم هەردولایان دەچنەوە نێو خێوەتەكانیان، یەكەم ڕۆژ بەشداری جەنگی كرد، (عبداللەی كوڕی سەعد)ی سەركردەی سوپاكەی نەهاتە بەرچاو، پرسیاریكرد لەكوێ یە؟ گوتیان: لەو كاتەوە گوێ ی لەجاڕچی (جەرجیر)بووە، كەدەیگوت: (هەركەس عبداللەی كوڕی سەعد بكوژێ هەزار دیناری دەدەمێ وكچەكەی خۆمی لێ مارە دەكەم).

بەڵێ لەو كاتەوە لەخۆی دەترسێ وخۆی پەنهان دەكات، ئەویش ئیبن سەعدی بانگ كردو پێ ی گوت: هەر ئێستا فەرمان دەردەكەی یەكێك جاڕ بدا بڵێ:

هەركەس سەری (جەرجیر)م بۆ بێنێ سەد هەزاری دەدەمێ و كچەكەی - جەرجیری - لێ مارە دەكەم و دەیكەمە والی بە سەر وڵاتەكەی خۆیەوە، ئەویش وایكرد، دوای ئەم بانگەوازە (جەرجیر) زۆر زیاتر لە (عبداللەی كوڕی سەعد) دەترساو مەترسی زیاتری ڕێ نیشتبوو.[1]

ئینجا ئیبن زوبێر بەئیبن سەعدی گوت: (بەرنامە - ی شەڕ - مان بەم شێوازە بێت كاتی زۆرمان دەوێ؛ ئەوان لەوڵاتی خۆیانن وكۆمەكیان بەبەردەوامی پێ دەگات، ئێمەش لەموسڵمانان و وڵاتمان دابڕاوین؛ بۆیە پێشنیار دەكەم بەیانی كۆمەڵێكی چاك لەجەنگاوەرە پاڵەوانەكان لەنێو خێوەتەكانیاندا بەئامادەباشی بەجێ بێڵین، ئێمەش تا نیوەڕۆ شەڕێكی باشیان لەگەڵ دەكەین وشپرزەیان

---

١ـ التأريخ الأسلامي (١٢/٣٨٨) .

دەکەین،کە نیوەڕۆ گەڕانیەوەلای خێمەکان،با جەنگاوەری نێو خێمەکان سواربن و لەنکاو بەسەر یاندا دەدەین، بەڵکو خودا سەرکەوتومان بکات) کۆمەڵێك لەهاوەڵە دیارەکان ئامادەبوون وئیبن سەعد ڕاوێژی لەگەڵ کردن، هەموویان لەسەر ئەم پێشنیارەی ئیبن زوبێر کۆك بوون.

دوای نوێژی بەیانی عبداللە دەستیکرد بە جێبەجێکردنی پیلانەکە، کۆمەڵێك جەنگاوەری بەجەرگ بەسازو بازی لەنێو خێمەکاندا مانەوە، ئەسپەکانیشیان زین کردبوو، جەنگاوەرەکانی تر چوونە مەیدانی جەنگەوە، جەنگێکی گەرم و گوڕیانکرد، نیوەڕۆدا هات، وەك ڕۆژانی تر ڕۆمەکان ویستیان بڕۆنەوە نێو خێمەکانیان، ئیبن زوبێر ڕێ ی لێگرتن و تاتەواو شپرزەی نەکردن یەخەی بەرنەدان، ئینجا هەردوك سوپا گەڕانەوە نێو سەربازگەکانیان؛ چونکە زۆر ماندوو و مجرۆ بوون چەکەکانیان دانا، لەم کاتەدا: عبداللەی کوڕی زوبێر فەرمانی بە جەنگاوەرانی نێو خێمەکان کرد، پەلاماری ڕۆمەکان بدەن، تاتێکەڵیان نەبوون هەستیان پێ نەکردن، بەیەك هەڵمەت (الله أكبر)یان کردو لێیان دان، ڕۆمەکان فریای چەکهەڵگرتن نەکەوتن، پاشا جەرجیر لەلایەن عبداللەی کوڕی زوبێر کوژرا، کچەکەشی گیرا، ڕۆمەکان کوشتارێکی زۆریان لێکراو تێکشکان، سوپاکەی ئیبن سەعد گەمارۆی شاری (سەبیتەڵە)یداو فەتحی کرد، هێندەی ماڵ گرت کە لەجەنگی تردا ئەوەندە دەستنەکەوتبوو، بەشی هەر سوارێك (٣٠٠٠)سێ هەزار دینار بوو وبەشی هەر پیادە یەکیش هەزار دینار بوو، دوای ئەمە سوپاکە لەوڵات دا بڵاو بۆوە تاگەیشتە (قەفسە)، ئینجا بەرەو قەڵای (ئەجم) ڕۆیشت، کە خەڵکی وڵات لەوێ خۆیان مەڵاس دا بوو، دوای گەمارۆدان بەئاشتی فەتحکرا، خەڵکی ئەفریقیا لەگەڵ سوپای موسڵمان بەئاشتی ڕێککەوتن، کچی پاشا جەرجیر بەر عبداللەی کوڕی زوبێر کەوت، دوای ئەم سەرکەوتنە مەزنە ئیبن سەعد موژدەی سەرکەوتنەکەی بە (عبداللەی کوڕی زوبێر)دا بۆ عوسمان نارد.[1]

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/٢٣٦،٢٣٧) .

ئیبن کەسیر دەڵێ: ئەمە یەکەمین هەڵوێست ـ ورووداوە ـ ناوو ناوبانگی عبداللەی کوڕی زوبێر تێدا دەرکەوێ ﷺ.[١]

ئەبو زوئەیبی هوزەلی شاعیر لەگەڵ ئیبن زوبێر لەسەردەمی عوسماندا بۆ (مغرب) دەردەچێت، لەوێ دەمرێ، ئەبو زوئەیب لەو جەنگەدا ئاوا بەئیبن زوبێر هەڵدەڵێ :

وصـــاحب صـــدق كـــسيد الـــضراء
يـــنهض فى الغـــزو نهـــضاً نجيحـــاً
وشـــيک الفـــصول بطـــي القفـــول
الا مـــشاحـــــــاً مشيحـــــــاً.[٢]

## ٥ ـ بەرگریکردن لە عوسمان کاتی گەمارۆدرانی:

ئەو ڕۆژانەی ئاژاوەچییەکان گەمارۆی مالی عوسمانی کوڕی عەففانیاندا بوو، ئیبن زوبێریش یەك لە پاسەوانەکانی عوسمان بوو، ئەو زۆری داوا لەعوسمان دەکرد ڕێگای بدا شەڕیان لەگەڵ بکات، بەلام عوسمان ڕێگەی نەدا.[٣]

کاتێکیش عوسمان فەرمانی بەپاسەوان وبەرگەریکەرەکانی کرد بچنە دەرەوە، ئیبن زوبێر ومەروانی کوڕی حەکەم سوور بوون لەسەر مانەوەیان لەلای و بەرگریلێکردنی[٤]،ئیبن زوبێر تیرو شیری زۆربەردەکەون و بەخەستی بریندار دەبێت و خەریك دەبێ گیانی دەرچێ، مەدائینی دەگێڕێتەوە: نۆکەری خاتو صەفیەی کچی حویەی چوار برینداری بەکۆڵی خۆی لەمالی عوسمان هێناونە دەرەوە، ئیبن زوبێر یەك لەو بریندارانە بووە.[٥]

---

١ـ البداية والنهاية (١٥٨/٧) .
٢ـ الشعر والشعراء لابن قتيبة (٦٥٣/٢) .
٣ـ الطبقات (٧٠/٣)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص٤١ .
٤ـ تأريخ خليفة ص١٧٤ .
٥ـ أنساب الأشراف (٥٦٤/١)، عبدالله بن الزبير للخراشي ص٤٢ .

ئیبن زوبێر لەمەککە وتاری دەداو دەیگوت: لەو ڕۆژەدا سێزدە برینم تێبوون،من ئیمڕۆ دەست لەسەر ئەوجێ برینانە دادەنێم، ئومێدەوارم لەباشترینی کردەوەکانم بن.[1]

لێرەدا هەڵوێستی ئیبن زوبێر لەبەرامبەر عوسمان دا ڕوون دەبێتەوە، کە عوسمان بەپێشەوای خۆی دادەنێ، دەستدرێژکارانی سەری بەتاوانبار دەزانێ، پێی وایە شەڕکردن لەدژیان باشترین کردەوەیە بەلای خوداوە، لێرەوە تێدەگەین: بەرگریکردن لە دۆستە ساڵحەکانی خوداو پارێزگاریکردنی گیان و ماڵ و ناموسیان و پشتیوانیکردنیان لەکردەوە هەرە چاکەکان دەژمێررێن ڕۆڵگێڕانی ئیبن زوبێر لەبەرگریکردنی عوسمان بایەخی تایبەتی خۆی هەبووە، کار بەوە گەیشتووە عوسمان دەیکاتە ئەمیری پاسەوانەکانی لەڕۆژی گەمارۆداندا، عوسمان گوتی: (کێ لەسەریەتی فەرمانەکانی من جێبەجێ بکات، باگوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئیبن زوبێر بێت).[2]

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: عوسمان فەرمانی بەئیبن زوبێر کرد پێشنوێژی بۆ دانیشتوانی نێو ماڵەکەی بکات، ئەویش لەو ڕۆژانەداو لەنێو هۆڵی خانوەکەدا پێشنوێژی بۆ کردن.[3]

٦ ــ لەجەنگی (جەمەل)دا:

ئیبن زوبێر لەو ڕۆژەدا پیادە بوو، نۆزدە برینی تێ کەوت، لەگەڵ مالیکی کوڕی حاریسی کوڕی ئەشتەر کەوتە زۆرانبازی، مالیك ئیبن زوبێری لەزەویدا، بەڵام نەیهێشت لەسەری ڕاست بێتەوەو توند ئامێزی گرت، هاواری کرد مالیك بکوژن بەمنیشەوە[4]، دوای هێنان وبردنێکی زۆری یەکتر ناچار یەکتریان بەرداو مالیك بە ئیبن زوبێر نەوێرا.

---

١ـ الطبقات، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي .

٢ـ الطبقات (٣/٧٠) .

٣ ـ الطبقات، نقلاً عن عبدالله بن الزبير للخراشي ص٤٢ .

٤ـ البداية والنهاية (١١/١٩٦) .

گـوتراوە: ئـەو ڕۆژە چـل و چـەند برینێکـی تـێ ببـوو وخـەڵتانی خـوێن ببـوو و لاشەکەی لەنێو کوژراواندا دۆزرایەوە، کە بینیان خەریکی گیانەڵا بوو، بەڵام نـەمرد، عائیشە ﷺ دەهەزار درەمی موژدانەدا بەو کەسەی هەواڵی مانی عبداللەی بۆ هێناو سوژدەی شوکری بردو سوپاسی خودای کرد، عائیشە عبداللەی خوارزای زۆر خـۆش دەویست و ڕێزو حورمەتی بۆ هەبوو، عوروەی کوڕی زوبێر دەڵێ: عائیشە ﷺ دوای پێغەمبەری خوداﷺو ئەبوبەکری بابیﷺ کەسی تری بەئەندازەی عبداللـەی کـوڕی زوبێر خۆش نەدەویست، هەروەها باوکم و عائیشە بەئەندازەیەك نزایـان بـۆ عبداللـە دەکرد کەبەو شێوەیە بۆ کەسێکی تر لەبەر خودا نەدەپاڕانەوە.[١]

**٧ ــ جیهادو تێکۆشانی لەسەردەمی معاویەداﷺ:**

کە (معاویەی کوڕی حەدیج) کاروباری ئەفریقیای کەوتـە بەردەسـت، عبداللـەی کوڕی زوبێر دەستی بەهێزی ئەو بوو لەجیهادو فەتح کردندا، معاویەی کوڕی حەدیج ساڵی ٤١ك بەسوپایەکی دەهەزاریەوە بەڕێکەوت و (بترزت)ی فەتح کرد، سـاڵی ٤٥ك چووە نێو (قـەیرەوان)ەوەو سریە سـەربازیەکانی لەوڵاتـدا بڵاوکردنـەوە، عبداللـەی کوڕی زوبێری بەرەو (سوسە) ناردو ئەویش فەتحی کرد[٢]، هەروەها عبداللـەی کـوڕی زوبێر لەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو لەهاوەڵان وەك ئەبو ئـەیوبی ئەنـساری وحوسـێنی کوڕی عەلی وعبداللەی کوڕی عومەرو ئیبن عەبباس وکەسانی تریش لەگەڵ سوپایەك بەسەرکردایەتی یەزیدی کوڕی معاویە بەرەو قوستەنتینیە بەڕێکەوت.[٣]

---

١ ــ البدایة والنهایة (١١/١٩٧) .
٢ ــ للبیان المغرب (١/١٦،١٧)، عبدالله بن الزبیر، محمود شاکر ص٤٣ .
٣ـ تأریخ الطبري (٦/١٤٨)، عبدالله بن الزبیر لمحمود شاکر ص٤٣ .

# بەشی سێهەم

## بزووتنەوەی عبداللەی کوڕی زوبێر لەسەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە.

**یەکەم: بەیعەتی یەزید.**

کاتێك معاویە مرد یەزید لەوێ نەبوو، کە هاتەوە نێژرا بوو، بەرەو ئەو شوێنەی باوکی لێ نێژرا بوو ڕۆیشت، نوێژی جەنازەی لەسەر کردو موسڵمانانی لەدوا بوو و چوا (الله أکبر)ی کرد.[1]

پاشان سوار بوو وچووە نێو شار، جاڕیدا خەڵك کۆبێتەوە ونوێژ دەکرێت، ئینجا چووە نێو کۆشکی (خەزڕا) کە باوکی دروستی کرد، خۆی شوشت وبەرگێکی بەنرخی ڕازاوەی پۆشی، ئینجا هاتە دەرو یەکەم وتاری بۆ جەماوەر خوێندەوە وەك ئەمیری ئیمانداران، دوای سوپاس وستایشی خودا، گوتی: ئەی خەڵکینە معاویە بەندەیەك بوو لە بەندە بچووکەکانی خودا، خودا نازو نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشت و پاشان بۆ لای خۆی بردەوە، ئەو لەوانەی دوای خۆی دێن باشتر بوو، لەخوارترە لەوانی پێش خۆی، پێش خودا ناکەوم وستایشی معاویە ناکەم، چونکە خۆی چاکتری دەناسێ، ئەگەر لێ ی خۆش بێت لەئەنجامی بەزەیی خۆیەتی، ئەگەر سزاشی بدات ئەوا بەهۆی تاوانی معاویە خۆیەتی، من دوای ئەو کاروبارم کەوتە دەست، لەسەر هیچ داواکاریەك قەڵس نابم، هیچ زێدەڕۆیی یەکیش لەکەس قبوڵ ناکەم، خودا ویستی لەسەر شتێك ببێ دەبێ ببێ، هەروەها گوتی: معاویە لەنێو دەریادا جەنگی پێ دەکردن، من کەس نابەمە دەریاوە بۆ جەنگ، معاویە دەیبردنە نێو خاکی ڕۆمەوە، من ناتانبەم بۆ ئەوێ، معاویە ماڵی لێ دەکردن

---

١ـ البداية والنهاية (٤٥٩/١١) .

بەسیّ یەك، من دەڵێم با هەمووی بۆ خۆتان بیّ) ئینجا خەڵك - ی ئەویّ - بڵاوەیان لێکردو کەسیان لەئەو بە لەپێشتر نەدەزانی.[١]

یەزید لەم وتارەیدا: ئەو سیاسەتەی کە بڕیاریداوە پیتیەوە پابەند بێت لەماوەی حوکمڕانی خۆیدا خستیە ڕوو، بەم سیاسەتەی توانی خەڵکی شام بۆ لای خۆی ڕابکێشیّ، زۆرینەی ئوممەتیش لەسەر بەیعەتدان بەیەزید کۆك بوون.

بەواتایەکی تر: دوا بەدوایّ مردنی باوکی بەیعەت بۆ یەزید نوێکرایەوە، جگە لەحوسێنی کوڕی عەلی و عبداللەی کوڕی زوبێرﷺ کەسی تر - لەهاوەڵان - دژایەتی نەکرد.[٢]

هەریەك لەم دوو - هاوەڵە گەور - انە شتی خۆیان لەگەڵ یەزید هەبووە، بەئیزنی خودای بەرزو مەزن لەمەو دوا دەبینین چبوە.

بەڵام تەواوی هاوەڵان لەپێناوی یەکبوونی وشەو بڕیارو پاراستنی یەکێتی ئوممەت وبەرگرتن لەفیتنە وئاژاوە بەیعەتیان بەیەزیددا، لەنێو ئەو هاوەڵانەدا عبداللەی کوڕی عەبباس وعبداللەی کوڕی عومەرو مەحەممەدی کوڕی حەنەفییە بەر چاو دەکەون.[٣]

خەڵکی شام وعێراق و وڵاتانی تریش بەیعەتیاندا، بەڵام وڵاتی حیجاز بەپێشەوایەتی حوسێنی کوڕی عەلی وعبداللەی کوڕی زوبێر لەدژی یەزید ڕاوەستا.

هەندێك هۆنراوە سەبارەت بەبەیعەتی یەزید:

هۆنراوەی عبداللەی کوڕی هەممام لەیەك کاتدا سەرەخۆشی بابی لیّ دەکاو پیرۆزبایی لەخۆشی دەکات:

إصبر يزيد فقد فارقت ذامقة — واشكر حُباء الذي بالملك حاباكا

لارُزءَ أعظم فى الأقوام نعلمه — كما رُزئت ولاعُقبى كعُقباكا

---

١- البداية والنهاية (١١/٤٦٠) .

٢- البداية والنهاية (١١/٤٦٧)، العالم الاسلامي في العصر الأموي ص١٣٠ .

٣- العالم الأسلامي في العصر الأموي ص١٣٠ .

أصبحت راعي أهل الدين كلهم فأنت ترعاهم والله يرعاكا
وفي معاوية الباقي لنا خلف إذا نعيت ولانسمع بمنعاكا.[١]

یەزید دوای بابی لەڕەجەبی ٦٠ك دەسەڵاتی گرتە دەست و٦٨ك بەمردنی کۆتایی بەدەسەڵاتی هات یەزید کاربەدەستەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی باوکی لەسەر پۆستەکانی خۆیان هێشتەوە، ئەمیر (مدینە) وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، ئەمیر (مكە) عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاس بوو، ئەمیر (کوفە) نوعمانی کوڕی بەشیر بوو، ئەمیر (بصرە) عبداللەی کوڕی زیاد بوو.[٢]

یەزید کاری خۆی لەسەر ئەو کەسانە چڕکردەوە کە لەژیانی باوکیدا بەیعەتیان پێ نەدابوو، گرنگترینیان حوسێنی کوڕی عەلی بوو لە(مدینە)؛ بۆیە نامەیەکی بۆ وەلیدی کوڕی عوتبەی ئەمیری مەدینە ناردو هەواڵی مردنی باوکی تێدا ڕاگەیاند بوو؛ دەقی نامەکە ئاوا بوو: بسم الله الرحمن الرحیم: لەیەزیدی ئەمیری ئیمانداران بۆ وەلیدی کوڕی عوتبە، دوای ئەمە: معاویە بەندەیەکی نێو بەندەکانی خودا بوو، خودا ڕێزی لێناو کردی بەخەلیفە، هەلی بۆ ڕەخساندو دەسەڵاتی پێدا، بەقەدەری خودا ژیاو بەئەجەل مرد، خودا بەزەیی لەگەڵ بنوێنێ، بەستایشکراوی ژیاو لەسەر چاکەو پارێزکاری مرد، والسلام.[٣]

وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبوسوفیان: لەبەرامبەر حوسێنی کوڕی عەلی وعبداللەی کوڕی زوبێر نەرمونیان وئاسانکار بوو وتۆبزی لێنەکردن بەیعەت بەیەزید بدەن؛ چونکە وەلید پیاوێك بوو حەزی لە لێبوردن بوو[٤]، بەبەزەیی وخاوەن شەهامەت وبەخشندە بوو[٥]، زۆر لەسزاو تۆڵەی خودا دەترسا؛ لەبەر ئەمە پەنای نەبردە بەر بەندکردن یان کوشتنی حوسێن، ئەو دەیگوت: سوێند بەخودا: حەز ناکەم حوسێن بکوژم، ئەگەر هەموو ماڵی دنیا خۆری بەیانی لەسەری هەڵاتبێ

---

١ـ الشعر والشعراء لابن قتيبة (٦٥٢/٢) .
٢ـ البداية والنهاية (٤٦٧/١١) .
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ الأخبار الطوال ص٢٢٨، يزيد بن معاوية للعقيلي ص٢٨ .
٥ـ تأريخ خليفة ص٢٣٣، يزيد بن معاوية ص٢٨ .

وبەسەریدا ئاوا بووبی هی من بیٚ، سبحان الله ! حوسێن بکوژم هەر لەسەر ئەوە دەڵێ: بەیعەت نادەم! بەخودا باوەڕ ناکەم کەسێك حیسابی خوێنی حوسێنی لەگەڵ بکرێت لەلای خودای گەورە لەقیامەت تاتەرازوو - ی خراپەکانی - سوك بێت. مەڕوان گوتی: ئەگەر ئەمە ڕای خۆت بێ بەڕاستی پێکاوەتە وکارت دروستە.[1]

یەکەم بڵێسەی ئاگری شەڕو فیتنە - ی نێو خۆ - کە لەنێو موسڵماناندا هەڵایسا، بەهۆی ڕژد بوونی یەزید بوو لەسەر وەرگرتنی بەیعەت لەحوسێن وئیبن زوبێر، هەر یەکەیان بۆی دەرکەوت: ئەگەر بەیعەت نەدا ئەوا دەبێتە قەربانی هەواو بیرە هەڵە شەکەی یەزیدو شیری پشتیوانانی خەلیفەی تازەی لەبەرامبەردا لەدژی ڕاست کراوەتەوە؛ بۆیە هەردوکیان - مەدینەیان بەجێهێشت و - پەنایان بەخودا گرت و ئەمانیان لە مەککەی پیرۆزو بەیتولحەڕام گرت.

یەزید کاتێك کاربەدەستەکانی باوکی بەسەر ویلایەتەکانەوە جێگیر کردنەوە ئەمە کارێکی باش بوو بۆ ئارامبوونی کاروبار تێیاندا، بەڵام زیرەکیەکەی خیانەتی لەگەڵ کردو تووشی هەڵەی گەورەی کرد، کاتێك سوور بوونی خۆی ڕاگەیاند بۆ بەزۆری بەیعەتدانی حوسێن وئیبن زوبێر، ئەم شێوازە داوایەی هەڕشەی پێوە بوو، هەڕشەی تۆقاندن وکوشتن، هەردوکیان بۆیان دەرکەوت: مانەوەیان لەژێر دەسەڵاتی حوکمڕانی یەزیددا بەترس و تۆقاندن تۆق دراوە، بۆیە بیریان لەجێگەی ئەمان وزەمان کردەوە، ئەم ئەمان زەمانەشیان نەدۆزیەوە تەنها لەڕێ ی چەکدارکردنی لایەنگرەکانیانەوە نەبیٚ، خۆیان وهێزە سەربازیەکەیان لە(مەککە) جێگیر کرد کەبۆ یەزید وپاریدەدارانی قورس و گران دەکەویٚ دەستی بیانگاتیٚ، ئەوان لەپەنا ماڵی خودا جێگیر بوون، کە خودا دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾ آل عمران:٩٧.

ئەم خڕ بوونەوەو خۆ پڕچەککردنە هیچ بەرهەمێکی لیٚ نەکەوتەوە جگە لە لەدەستدانی ژیان وگیانی هەزاران موسڵمان، لەسەروی هەموشیانەوە حوسێنی

---

١ـ تأريخ الطبري (٦/٢٥٩) .

کوڕی عەلیﷺ کە لەکەربەلا لەلایەن تاقمێکی ستەمکاری نێو سوپای یەزید شەهید کرا.[١]

ئەمە هەمووی لەئەنجامی هەڵەکەی یەزید بوو، ژیانی - حوکمڕانی - بەمە دەستی پێکردو لەگەڵیدا مایەوە تا ئەو ڕۆژەی تێیدا مرد، نەیتوانی لێ ی دەرباز بێت، گەورەی زنجیرەی غەڵەتەکانی خەلیفە ڕۆژ بەڕۆژ درێژ تردەبوو، لەگەڵ زۆر بوونی کاروبارەکان غەڵەتەکان گەورەتر دەبوون، گوریسی گرفتەکان گرێیان زیاتر دەبوو، کەخەریکی چارەسەری کێشەیەك دەبوو، کێشەیەکی گەورەترو سامناکتری بۆ دەهاتە پێشەوە، سەرەتای کێشەکان بەسوور بوونی یەزید لەسەر بەتۆبزی بەیعەتدانی حوسێن وئیبن زوبێر دەستی پێکرد، ئینجا سەری کێشا بۆ دروستبوونی بەرەیەکی بەرهەڵستکارو ئامادە بۆ کوشتار، لەوێشەوە بەرەو کارەساتی کەربەلا، کارەساتی کوژرانی کوڕی کچی پێغەمبەری خوداﷺ، ئینجا توڕە بوونی موسڵمانان وراگەیاندنی ئیبن زوبێر بۆ دەرچوونی لەدژی خەلیفە، ئەم تووڕە بوون ودوژمنکارییە درێژەی کێشاو کارەساتی (حەرە)ی لێکەوتەوە، دەم وچاوو ڕەنگوڕووی خەلیفە لەبەر چاوو دڵی موسڵمانان بێزار، پاش کەمێك دوای ئەم ڕوداوانە دەمرێ، خەونی معاویە دەربارەی وەلی عەهدەکەی چی بەسەرهات؟.

بەپێ ی زۆرینەی بۆ چوونەکان، یەزید لەبەر چەند هۆیەك کەوتە نێو تەڵەی ئەو هەڵە زەقانەوە، وەك: نەبوونی ڕاوێژکاری داناو زانا لەدەورەی و کەمی تەمەنی و کەمی شارەزایی و بەهەمان شێوە یەزید عەقڵی بابی نەبوو و ئەو ئیرادە بەهێزەشی نەبوو بتوانێ کێشەکان بەئاشتی وبێ ئاژاوە چارەسەر بکات.

---

١ـ الأمويون بين المشرق والمغرب (١/١٩٨) .

# ئەو کارەساتانەی لەسەردەمی یەزیددا ڕوویاندا

کوژرانی حوسێنﷺ، ڕوداوی (حرة) لەمەدینە، گەمارۆدانی مەککە بەمەبەستی لێدانی ئیبن زوبێر.

یەزید مۆرێکی ڕەشی بەسەردەمی حوکمڕانی خۆیەوە نوساند، بەهەموو ئاوی دەریاکان لاناچێت، ئاوی زولاڵی ڕوبارەکانیش ناتوانێ تاڵاییەکەی بگۆڕن.[١]

ئەهلی سوننە و جەماعە بەیعەتی یەزید بەدروست دادەنێن، بەڵام دوو ڕەخنەیان لێ گرتووە:

**١ ــ معاویە بیدعەیەکی نوێ ی داهێنا لەخیلافەتدا:**

ئەویش گواستنەوەی ئەو پۆستە لەبابەوە بۆ کوڕو لەکوڕەوە بۆ نەوەو نەتیجە، دوای ئەوەی دیاریکردنی خەلیفە بە دەست ئەهلی شورا بوو و حیساب بۆ نزیکایەتی و خزمایەتی نەدەکرا چ جای بۆ کوڕ!، لێرەدا ئەهلی سوننە و جەماعە ئەم یاسا نوێ یە ـ یاسای میراتگری لە خیلافەدا ـ ڕەت دەکەنەوە بەبێ ڕوانین بۆ جۆری کەسەکە.

**٢ ــ لەڕوانگەی ئەهلی سوننەو جەماعەوە:**

ئەو کاتەی معاویە (یزید)ی کردە وەلی عەهد، خەڵکانی لەپێشترو باشتر هەبوون لەیەزید وەك: ئیبن عومەر وئیبن زوبێر وحوسێن وکەسانی تریش.[٢]

بەڵام لەڕوانگەی شیعە: دەبێ ئیمامەت یان خیلافەت تەنها لەعەلی وڕۆڵەو نەوەکانی بێ، ئەوا ڕەخنە لەخودی بەیعەتی یەزید ناگرن، بەڵکو ڕەخنەیان ڕووی لەهەر بەیعەتێکە کەبۆ غەیری عەلی وڕۆڵەکانی دەبەسترێ، ڕەخنە لەبەیعەتی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان ومعاویە دەگرن؛ چونکە پێیان وایە ئەم مافە بە(نص) بۆ

---

١ـ الأمويون بين المشرق والمغرب (١/١٩٩)، بتصرف كبير .

٢ـ حقبة من التأريخ ص١٢٤ .

دەست ڕۆیشتووتر و شارەزاترن، زەقترین بەڵگەی ئەم قسەیەمان ئەوەیە: تەماشا دەكەین مەڕوانی كوڕی حەكەم خودی خۆی سەركردایەتی ئەو سوپایەی كرد كە هێرشی كردە سەر وڵاتی (میسر)و لە ژێر پێی والی عبدالله ی هێنایە دەرەوە و خستیەوە ژێر ڕكێفی دەوڵەتی ئومەویەوە، ئینجا دوای ئەمە (عبدالملك)ی كوڕی دەكاتە سەركردەی ئەو سوپایەی كە بۆ جەنگی عێراق دەنێرێ، بەم كارەیان دەیان بینی ڕاستەوخۆ چ شتێك لە گۆڕەپانی ڕووداوەكاندا دێتە ئاراوە و لە لایەكی تریشەوە لایەنی دەروونی و مەعنەوی هێزە هێرش بەرەكە نەدەڕووخا و بەرز دەبۆوە.

لە بەرامبەریشدا دەبینین عبدالله ی كوڕی زوبێر خۆی لە (مەككە) دەمێنێتەوە و بۆ پێكانی ئامانجەكانی و بە دەستهێنانی سەركەوتنەكانی جەنگ پشت بە سەركردەی سوپاكان، یان والی هەرێمەكانی دەبەستێت، عبدالملك ڕەخنە لەم سیاسەتەی عبدالله دەگرێت و دەڵێ: ئەگەر عبدالله ی كوڕی زوبێر خەلیفە بووایە وەك خۆی گوتوویەتی خۆی دەردەخست و خودی خۆی سەركردایەتی پشتیوانەكانی دەكرد و كلكی خۆی لە حەڕەم نەدەچەقاند.[١]

وەك دەكرێ: ئەم جەنگ و ململانێیانە دەكرێت دەبینین: (بەنو ئومەییە) هەمیشە لایەنی هێرشبەر و پەلاماردەر بوون، عبدالله ی كوڕی زوبێریش هەمیشە لە سەنگەری بەرگری و بەرەنگاریدا بووە.[٢]

## ١٠ــ كەش و هەوا و زەمینەی پەیدابوونی بزوتنەوەی ( عبدالله ی كوڕی زوبێر ):

ئەگەر بە ویژدانەوە قسە بكەین، دەبێ بڵێین: ئەو بارودۆخە ناسازەی بزوتنەوەكەی عبدالله ی لە خۆگرتبوو بە هۆكاری هەرەگەورەی ڕووخانی خیلافەتەكەی دادەنرێت، چونكە لەم سەردەمەدا چەندین بزووتنەوەی مەزهەبی و

---

١ـ الطبقات (٥/٢٣٢).

٢ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٩).

سیاسی و عەشیرەتگەری لە شەرع دەرچوو پەیدابوون و ئارامی و ئاسایشی جیهانی ئیسلامییان تێکدا، ئەوەلەکاتێکدا ئارامی سیاسی بەگرنگترنی مەرجی ڕاوەستاو بوونی حکومەتێکی دامەزراو دادەنرێت، ماوەیەکی دوور و درێژ عبدالله بە شەڕی (خەواریج)ەکان سەرقاڵ بوو، بزووتنەوەکەی موختاریش زۆری ماندوو کرد و کاتێکی زۆری لێ بەزایەدا و خەڵکانێکی زۆری لێ بە کوشت دا، ئەم بزووتنەوە مەزەبیانە هێندەیان عبدالله بە خۆوە سەرگەرم کرد کار بەوە گەیشت کەمتر بیر لە ڕێکوپێك کردنی دەوڵەتەکەی بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا وزەیەکی زۆری ماددی و مرۆییان لێ بە فیڕۆدا.[1]

## چوارەم: لاواندنەوەی عبدالله ی کوڕی زوبێر

عبدالله ی کوڕی زوبێر لەلایەن ژمارەیەك شاعیرەوە بە قەسیدەی دوور و درێژ و گریان هێنەر و خەمبار لاواندراوەتەوە، مێژوو تۆماری کردوون و شەوگاریان و سەرەسەدەکان و ئاڵوگۆڕی زەمانە و لافاوی هێرشەکان بە لایدا نەداون.

(عبدالله ی کوڕی أبی مسروع) دەیلاوێنێتەوە و دەڵێ:

لقد أدركت كتائب أهل حمص    لعبدالله طرفاً غير وعل
شجاع الحرب اذشدّت وقوداً    وللحادين خير محل رحل
ومن ذا يكره الأبطال منه    اذا إعتنشوا طريقاً غير سهل
فما للشامتين بنا أصيبوا    وقلّوا من سراتهم لمثل[2]

(قەیسی کوڕی هەیسەمی سەلەمی) دەڵێ:

فقدنا مصعباً وأخاه لما    نفت سماؤهما المخولا
وكنا لايرام لنا حريم    نسحب فى مجالسنا الذيولا

---

١ـ عبدالله بن الزبير، للخراشي (ص: ١٩٩).
٢ـ تاريخ ديمشق، لإبن عساكر (٣٠/١٩٣).

اذا أمـن الجنـاب وإن فزغنـا  ركبنا الخيـل واجتنبنا الـشَّليلا
ونرمـي بالعـدواة مـن رمانـا  ونـوطئهم بهـا وطـأ ثقـيلا
فيـالهفي ولهـف أبـي وأمـي  لقـد أصـبحن بعـدها ذلـيلا
ويالهفـا علـى مافـات مـنى  ألا أصـبحت فى القتلـى قتـيلا
ولم أصبح لأهـل الـشام نـصبا  يـذكرني ابن مـروان الـدُّحولا
فـلا رفـدا يعـد ولا غنـاء  ولا اذنـا ولا حبـسا جمـيلا
ولكـن بـين ذلـك بـين بـين  لقد ضل ابن مروان السبيلا.[1]

---

١ـ تاريخ ديمشق، لإبن عساكر (٣٠/١٩٣، ١٩٤).

# ناوەڕۆك